# پێشەکی

بسم الله الرحمان الرحيم

لەم ساڵانەی دوایدا کۆمەڵێک یانەو سایتی زۆر دروست کراون و هۆشیاری دەدەن بە خەڵک لەسەر چۆنیەتی هاک و خۆپاراست، بەڵام بابەتەکان وا نین کە عامی خەڵک لێی تێبگات، واتە زۆربەی بابەتەکان تەقلیدین و لە یوتوب و سایتە ئینگلیزی و عەرەبیەکانەوە وەرگیراون، بەبێ ئەوەی ئەوکەسەی کە ئەینوسێت هیچ ئەزمونێکی پێش وەختەی هەبێت لەسەر ئەو بابەتە، ئەوانەی کە بابەت بلاو ئەکەنەوە لە یانەکان ناڵیم هەموویان بەڵام زۆرینەیان بێ عیلمن وە بۆ ئەوە بابەت دا ئەنێن کە خۆیانی پێوە هەڵکێشن، یاخود ئەگەر خاوەن ماڵپەربێت مەبەستی لە بلاوکردنەوەی ئەم بابەتانە بە شێوەیەکی گشتی بازرگانیە.

دوای گەڕانێکی زۆر بە ماڵپەڕ و یانە ئینگلیزیەکاندا کۆمەڵێک زانیاریم کۆکردەوە لەسەر خۆپاراستن و کردم بە کتێبێک، دوای ئەوەی کە خۆم تاقیکردنەوەم لەسەر هەموویان کرد.

مەبەست لە نوسینی ئەم کتێبە هۆشیار کردنەوەی خەڵکە لەو بەناو هاکەرانەی کە تەنها شارەزاییان لە هاکە سەرتاییەکاندا هەیەو لە یانە ئینگلیزی و عەرەبیەکانەوە فیربوون، هەندیکیان بۆخۆشی خۆیان فیری هاک دەکەن وە هەندێکیشان بۆ بەدەست هێنان یاخود لەناوبردنی زانیاری کەسانی تر خۆیان فێر دەکەن، بۆ هەر مەبەستێک خۆیان فێرکەن ئیمە ناهێڵین خۆیان لەسەر ئێمە فێرکەن و بمانکەن بە ئامانجێکی گەمژە.

دوای تەواو کردنی ئەم کتیبەو جێبەجیکردنی هەنگاوەکان، ئەگەر جاران ڕێژەی پاریزگاری کردن لەخۆت 5% بوبێ ئێستە ئەبێت بە 90%.

سڵاو خۆشەویستان
لەم بابەتەدا گەشتێک ئەکەین بەناو زانیاریە سەرەتاییەکاندا دەربارەی کۆمپیوتەرو ئاشنا بوون بەو بەرنامانەی کە پێویستمانن بۆ خۆپاراستن لە هاک.

لە ئێستادا ئێمە لە جیهانێکداین کە زۆرجار گوێمان لەناوی هاکەرو هاک ئەبێت، لەپڕ ئەڵین فلاَن گروپ یاخود فلاَن هاکەر ئەتاکی شوێنێکی کردو زەرەرێکی زۆری لێدا، جا لەم جیهانەدا خەڵک ئەبێت بە دوو دەستەوە دەستەیەکیان کە ئەیانەوێ خۆیان لە هاککەر بپارێزن کە ئەمە زۆرینەی خەڵکن، وە دەستەیەکیان کە ئەیانەوێ خۆیان ببن بە هاککەر.

ئەگەر کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت بەکاربهێنین هاککەر بین یاخود نا پێویستە نەبین بە ئامانجێکی گەمژە، هاکەر چۆن ئەبێت بە ئامانجی گەمژە؟
بەڵێ ڕاستە ئەمە پرسیارێکی جوانە هاکەر چۆن ئەبێت بە ئامانجێکی گەمژە، کاتێک کە زانیاری لەسەر خۆپاراستن نیەو بنچینەکانی هاک نازانێت و ئەیەوێت ئەوەی کەسە گەورەکان بەدەستیان هێناوە ئەمیش بە ڕێگەیەکی ئاسان بەدەستی بهێنێت.

ئێمە نامانەوێ ببین بە ئامانجێکی گەمژە، وە ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان دەستمان کردن بە هاک زانیاری سەرەتایمان هەبێت لەسەر ئەنجامی کارەکەمان، چونکە زۆر کەس حەز ئەکات فێری هاک بێت وە لەو نێوەندەدا کۆمەڵێت شتی زۆر لەدەستت دەدات بەهۆی نەزانی خۆیەوە، ئەگەریش هاکەر نەبین هەر پێویستمان بە خۆپاراستن هەیە.

لێرەدا ئەمانەوێت کۆمەڵێک خاڵ و تێبینی گرنگ ئاشنا بکەین بە تۆ کە پێویستە جێبەجێی بکەیت ئەگەر هاککەر بیت یاخود نا.

## توانای کۆمپیوتەرەکەت چەندە؟

پێش ئەوەی دەست بکەیت بەم کارە یاخود هەر کارێکی تر پێویستە بزانیت توانای کۆمپیوتەرەکەت چەندە، ئەمانە توانای کۆمپیوتەرن – memory size : – RAM – HDD خێرای processor – توانای graphics card...

---

**بەدەست هێنانی زانیاری کۆمپیوتەر لەسەر ویندۆز**

**بەدەست هێنانی زانیاری لەسەر کۆمپیوتەرەکەت لە Windows XP بە بەکارهێنانی MsInfo32**

کلیک لە Start بکە پاشان بنوسە Run




پاشان ئینتەر یاخود کلیک بکە

پاشان بنوسە MsInfo32 و ئینتەر یاخود ok بکە




لەبەشی System Summary ئەتوانی زانیاری لەسەر ئەم بەشانەی کۆمپیوتەرەکەت بەدەست بهێنیت (System , physical memory , virtual memory , BIOS version ...)




لەبەشی "Hardware resources" ئەتوانی زانیاری لەسەر هاردەکەت بەدەست بهێنیت.

لەبەشی "Components" ئەتوانی زانیاری لەسەر ئەم بەشانەی کۆمپیوتەرەکەت بەدەست بهێنیت (video, audio, other multimedia…)




لەبەشی Software Environment ئەتوانیت زانیاری لەسەر drivers و service بەدەست بهێنیت.




لەبەشی Internet Settings ئەتوانیت زانیاری لەسەر براوسەرەکەت Internet Explorer بەدەست بهێنیت




---

## بەدەست هێنانی زانیاری لەسەر کۆمپیوتەرەکەت لە Windows XP بە بەکارهێنانی DxDiag

کلیک لە Start بکە پاشان بنوسە Run

پاشان کلیک یاخود ئینتەر بکە




پاشان بنوسە DxDiag و ئینتەر یاخود ok بکە




پاشان لە بەشی سەرەوە ئەم مینوە هەیە , System , Display , Sound Network,

ئەتوانیت زانیاری لەسەر ئەو بەشانە وە زیاتر بەدەست بهێنیت.




---

**بەدەست هێنانی زانیاری لەسەر کۆمپیوتەرەکەت لە Windows 7,8,10**

ئەم هەنگاوانە جیبەجێ بکە Start› Control Panel› System

پاشان پەنجەرەیەکت بۆ ئەکرێتەوە هەموو زانیاریەکانی تێدا نوسراوە.

یاخود ئەتوانی وەک Windows XP بە ڕێگەی dxdiag زانیاریەکانت بەدەست بهێنیت

Start › Run › dxdiag › ok







---

## بەدەست هێنانی زانیاری کۆمپیوتەر لەسەر ماک

کلیک لە لۆگۆی ئەپڵ بکە




پاشان کلیک لە About This Mac بکە




لێرەدا ئەتوانی زانیاری لەسەر کۆمپیوتەرەکەت بەدەست بهێنی



**بەدەست هێنانی زانیاری کۆمپیوتەر لەسەر لینکس**

بەم هێڵکاریەدا برۆ

Applications › Accessories › Terminal

یاخود Alt+F2 پاشان بنوسە gnome-terminal ئینتەر یاخود Run بکە




پاشان کە Terminal کرایەوە ئەم کۆماندانەی خوارەوە بەکار بهێنە بۆ دەستکەوتنی ئەو زانیاریانەی کە ئەتەوێت.




finger username: بۆ بەدەست هێنانی زانیاری سیستەم لەسەر ئەو user کە تۆ بەکاری ئەهێنی بۆ نموونە وەک ئەو ناوە کە من شاردومەتەوە لەسەرەوە ( finger Ben ) فینگەر وەک خۆی ئەنوسیتەوە پاشان سپەیسێک ئەکەیت ئینجا ئەو username خۆت کە بەکاری ئەهێنیت.

```
[redacted]@kali: ~
File  Edit  View  Search  Terminal  Help
[redacted]@kali:~$ finger [redacted]
Login: [redacted]                                  Name: [redacted]
Directory: /home/[redacted]                        Shell: /bin/bash
On since Fri Nov  4 10:56 (EDT) on tty2 from :0
   24 minutes 12 seconds idle
No mail.
No Plan.
[redacted]@kali:~$
```

cat /proc/version: بۆ زانینی ڤێرژنی سیستمی لینکس و جۆری سیستمەکە.

```
[redacted]@kali:~$ cat /proc/version
Linux version 4.6.0-kali1-686-pae (devel@kali.org) (gcc version 5.4.0
 20160609 (Debian 5.4.0-6) ) #1 SMP Debian 4.6.4-1kali1 (2016-07-21)
```

cat /proc/filesystems: بۆ پیشاندانی جۆری فایلی سیستمەکە.

```
[redacted]@kali: ~
File  Edit  View  Search  Terminal  Help
[redacted]@kali:~$ cat /proc/filesystems
nodev   sysfs
nodev   rootfs
nodev   ramfs
nodev   bdev
nodev   proc
nodev   cpuset
nodev   cgroup
nodev   cgroup2
nodev   tmpfs
nodev   devtmpfs
nodev   debugfs
nodev   tracefs
nodev   securityfs
nodev   sockfs
nodev   bpf
nodev   pipefs
nodev   hugetlbfs
nodev   devpts
nodev   pstore
nodev   mqueue
        ext3
```

free: بۆ زانینی بڕی قەبارەی سیستم

```
[redacted]@kali:~$ free
              total        used        free      shared  buff/cache
 available
Mem:        2068788      389464     1101660        7544      577664
   1442348
Swap:       2095100           0     2095100
```

---

## ئەو بەرنامانە چین کە پێویستە دایبەزێنیت؟

ئەم فێرکاریەم لەسەر (ویندۆز) ئامادە کردووە بۆیە ئەو بەرنامانەی لەسەر ویندۆز کار ئەکات من لەم فێرکاریەدا بەکاری ئەهێنم و بۆ ئێوەی دا ئەنێم، وە باوەڕیش ناکەم کێشەی هەبێ لەگەڵ سیستمەکانی وەک ماک و لینکس بەڵام ئەگەر هاتوو پشتگیری ئەو سیستمانەی نەکرد ئەتوانن لە گوگل بەدوای شوێنگرەوەی ئەو بەرنامانەدا بگەڕێن و بەدەستی بهێنن.

یەکێک لە خاڵە گرنگەکان بەکارهێنانی ئەنتی ڤایرۆسە بۆ سیستمەکانمان، بۆ دابینکردنی پارێزگاری بە ڕێژەیەکی بەرز تەنانەت ئەگەر پارێزگاری تەواویش نەبێت.

هەر کۆمپیوتەرێک کە ڕەپت ببێ بە ئینتەرنێتەوە پێویستی بە ئەنتی ڤایرۆس هەیە. ئەنتی ڤایرۆس هێڵی یەکەمی بەرگریە. پێویستە هەموو بەکارهێنەرێکی کۆمپیوتەر ئەنتی ڤایرۆسی هەبێت ئەگەر هاکەریش نەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا هاککەر ئەتوانێ ئەنتی ڤایرۆس تێبپەڕێنێت بە بەکارهێنانی crypters. بەڵام هەر گرنگە لەناو سیستمدا هەبێت بۆ چاک کردنەوەو پاراستی فایلەکان.

بەتەنیا ئیعتماد مەخەر سەر windows defender ئەگەر بەکارهێنەری مایکرۆسۆفتی وە بە هەمان شێوە بۆ سیستمەکانی تریش، ڕاستە

windows defender به خۆڕاییەو ئاسانە بۆ بەکارهێنان بەڵام توانای کۆنترۆل کردنی سیستمی کەمتر لە 90% لەچاو ئەو ئەنتی ڤایرۆسانەی کە دروست کراون هەندێکیان بە پارەن و هەندێکیان بە خۆڕای.

مانای ئەوە نیە کە ئێمە windows defender بەدڵ نەبوو بمانەوێ پارەیەکی زۆر سەرف بکەین بۆ بەدەست هێنانی ئەنتی ڤایرۆسێکی بەهێز، نەخێر ئەتوانین ئەو ئەنتی ڤایرۆسانە بەکاربهێنین کە بە خۆڕاین یاخود ئەو ئەنتی ڤایرۆسانەی کە بەپارەن کراکیان بکەین یاخود بە کراک کراوی دایان ببەزێنین، ئەگەر ئەتەوێت ئەنتی ڤایرۆسێک بکڕیت ئەوە مەچۆ یەکسەر پەلاماری دانەیەک بدەیت بڵێی ئەمە باشە یاخود خەڵک پێی وتووم ئەمە باشە، چونکە هەندێکیان تەنها بۆ کاری بازرگانی دروست کراون بە ئیشپێکردنیان کۆمپیوتەرەکەت خاو ئەبێتەوەو کار ئەکاتە سەر شەبەکەی ئینتەرنێتەکەت.

**ئەمە باشترین جۆرەکانی ئەنتی ڤایرۆسن بەپێی تاقیکردنەوە:**

Avira

AVG

Panda

Eset

Comodo

Avast

ZoneAlram

Immunet

Bitdefender

Windows Defender

ئەو بەستەرانەی سەرەوە هەمووی هی سایتی سەرەکین بەڵام ئەگەر هاتوو نەتان توانی بە خۆڕای بەدەستی بهێنن ئەتوانن لە گوگڵ یاخود سایتەکانی تۆرێنت بەکار بهێنن بۆ بەدەست هێنانیانی ئەنتی ڤایرۆسەکان یاخود کلیلی ئەکتیڤ و کراک کردنیان، لە خوارەوە دوو باشترین پێگەی تۆرێنت هەیە لە ئێستادا.

http://extratorrent.cc/

http://1337x.to/

---

### دابەزاندن و دامەزراندنی Avira

لەسەرەوە لینکی هەموو بەرنامەکانی ئەنتی ڤایرۆسم دەمج کردووە لەگەڵ ناوەکانیاندا ئەتوانن کلیکی لێبکەن و بچنە ناو سایتەکە یاخود ناوی بەرنامەکە لە گۆگڵ بنوسن و بەدەستی بهێنن.

بەپێی وێنەکان برۆ بۆ ئەوەی بەبێ کێشە بەرنامەکە دابەزێنیت.



Avira Free Antivirus

Avira Free Antivirus is not only one of the world's most popular basic virus scanners, it's also the easiest to use. With pushbutton convenience, this free program removes viruses and other malware. Plus, new features in the SearchFree Toolbar now include a website safety advisor and the ability to block advertising companies from tracking you online!




کە بەرنامەکە دابەزی Runی بکە پاشان چاوەڕێبکە تا دا ئەمەزرێت.






کەمێک چاوەڕێ بە تا تەواو دەبێت




کۆمەڵێک بەرنامەت ئەداتێ لەکاتی دابەزاندنی ئەنتی ڤایرۆسی Avira ئەتوانی دایانبەزێنیت و سوودیان لێ ببینی.

بۆ نموونە ئەم بەرنامەیە aVPN بەکاردێ بۆ گۆڕینی ئایپی و کردنەوەی ئەو وێبسایتانەی کە لەسەر وڵاتەکەت بلۆک کراون و ناکرێنەوە.

بۆ دابەزاندنی هەر یەکێکیان کلیک لەو دوگمەمەی ژێر خۆیان بکە.




ئەم بەرنامەیەش بەکاردێ بۆ خێراکردنی کۆمپیوتەرەکەت بە شێوەیەکی بەرچاو.



Avira System Speedup

- Free trial version
- Improve your PC's speed and performance
- Free up storage and repair your disks

Install

ئەم بەرنامەیەش گەڕانەکانت ئەپارێزێت لەسەر ئینتەرنێت و بزوێنەری گەڕانەکە خێراتر دەکات.



Avira SafeSearch Plus

- Warns you of infected sites in your search results
- Runs faster and safer than other search providers
- Offers customizable settings with region/language selector

Add it for Free

بەکاردێ بۆ نوێکردنەوەی بەرنامەی Avira بەشێوەیەکی خۆکارانە.



Avira Software Updater

- It's free
- Keeps essential applications up to date
- Protects your computer by patching vulnerabilities from outdated software

Install

ئەمەش بریتیە لە براوسەرێکی بەسوود کە زانیاریەکانت ئەپارێزێت کاتێک کە کۆنێکت بووی بە WiFi کەهی خۆت نەبێ وەک WiFi کافێ و سەنتەرەکان.




پاشان چاوەڕێ بکە تا بە تەواوەتی بەرنامەکە دا ئەمەزرێت.




دوای ئەوەی کە بەرنامەکە ئینستۆڵ بوو پەنجەرەیەکی ترمان بۆ ئەکرێتەوە بەم شێوەیە چاوەڕێ ئەکەین تا تەواو ئەبێت.




پاش ئەوەی کە ئەوەی سەرەوە تەواو بوو پەنجەرەیەکی ترمان بۆ ئەکرێتەوە کە پێمان ئەڵێت بەرنامەکە بە سەرکەوتووی دامەزراوە.



دوای ئەوەی کە بەرنامەی ئەنتی ڤایرۆسەکەمان کردەوە ئەم پەنجەرەیەمان بۆ ئەکرێتەوە.




لە سەرەوە نووسراوە Your Computer is secure واتای ئەوە نیە کە کۆمپیوتەرەکەت بە تەواوەتی پارێزراوە بەڵکو واتای ئەوەیە کە ئەم بەرنامەیە هیچ ڤایرۆس و مالوەرێکی نەدۆزیوەتەوە لەناو کۆمپیوتەرەکەتدا. واتە ئەگەری زۆرە بوونی نەبێت.

All Service are working correctly واتە هەموو خزمەتگوزاریەکانی ئەم بەرنامەیە بە سەرکەوتووی کار ئەکەن، ئەو خزمەتگوزاریانەی کە پێویستبێ بۆ پاراستینی کۆمپیوتەرەکەت ئەم بەرنامەیە خۆکارانە چالاکی ئەکات. بەڵام ئەگەر تۆ یەکێکیان بکوژێنیتەوە ئەوە ئەگەری زیاترە تووشی ڤایرۆس یاخود مالوەر بیت.

لە تەنیشت زۆربەی فرمانەکاندا ئەم ئایکۆنە هەیە کە دەسەڵاتت پێ ئەدات زیاتر ئیش لەگەڵ بەرنامەکە بکەیت بەو شێوەیەی کە خۆت ئەتەوێ.



لێرەدا بەشی System scannerمان هەیە، واتە بە شێوەیەک فایلەکانی ناو کۆمپیوتەرەکەت سکان بکات.

All Files واتە هەمووی سکان بکە (ئەمە لەوانەیە زۆر پێویست نەبێت چونکە کاتی سکانەکە زۆری پێ ئەچێت و هەموو فایلێکیش پێوییستی بە سکان کردن نیە).

Use smart extension واتە ئەو فایلانەی کە لەلایەن بەرنامەکەوە شکیان لەسەرەوە کۆمپانیاکە ئەو بەرنامەیەی وا دروست کردووە بۆ ڕێگری کردن لە ڤایرۆس مالوەر وە ئەو ڤایرۆس و مالوەرانەشی پێ ناساندوو کاتێک کە درکی کرد کە شتێکی نامۆ لەناو کۆمپیوتەرەکە هەیە ئاگادارت ئەکاتەوەو ئەیسرێتەوە.

Use file extension list ئەمە جۆری ئەو فایلانە دیاری کراوە کە سکانیان ئەکات بۆ نموونە ئەم بەرنامەیە ئەو فایلانە سکان ئەکات کە ئەم پاشگرانەیان هەیە




بە insert ئەتوانی پاشگری دیکە زیاد بکەیت بۆناو لیستەکە بۆ ئەوەی بیپشکنێ بۆ نموونە exe.

بە delete ئەتوانی ئەو پاشگرەی کە پێویستت نیە سکانی بکەیت بیسرِیتەوە.

بە default ئەتوانی هەڕەمەکیانە پاشگر زیاد بکەیت

بە Help ئەتوانیت زانیاری زیاتر بەدەست بهێنیت لەسەر ئەو بەشە، ئەگەر ئینگلیزیەکەت باشە ئەوە بە باشی لێی تێ ئەگەیت ئەگەریش باش نیە ئەوە ئەتوانی لە ڕێگەی قاموسەوە بیکەیتەوە بە کوردی، ئەگەر بە تەواوەتیش لێی تێنەگەی لێی نزیک دەبیتەوە.




لەم بەشەدا هەڵبژاردن ئەخاتە دەستی خۆتەوە کە ئەنجامی سکان کردنەکە چۆن بێت.

Allow all user to start scan واتە تۆ چەند ئەکاونتت هەبێت لەسەر کۆمپیوتەرەکەت هەموویت بۆ سکان بکات.

Allow stopping the scanner واتە ئەڵێ ڕێگەت پێبدەم کە سکانەکە بوەستێنی؟ تۆ دایمە با ئەوە چالاک بێت چونکە هەندێک جار سکانەکە زۆری پێ ئەچێت و تۆش پەلەت پێویستە سکانەکە کۆتای پێ بهێنیت.

بە scanner priority ئەتوانی جۆری سکان کردنەکە هەڵبژێری، واتە بە چ ئاستێک سکانت بۆ بکات، خۆی بە هەڕەمەکی Mediumی داناوە تۆ بیکە بکە high یاخود هەر بە Medium بەڵام با Low نەبێت.



لێرەدا بەشی ڕاپۆرتمان هەیە کە ڕاپۆرت ئامادە دەکات لەسەر سکانەکەو جۆری ئەو فایلانەی کە سکانی کردوون وە چی نامۆی دۆزیوەتەوە.




ئەم بەشە تایبەتە بە دابینکردنی پارێزگاری لەکاتی بەکارهێنانی ئینتەرنێت خۆی چۆن بوو دەسکاری مەکە، پێویستە وەک وێنەکە بێت.

Private network ئەو ئینتەرنێتەوە کە خۆت بەکاری ئەهێنیت و تایبەتە بە خۆت.

Public network ئەو ئینتەرنێتانەیە کە لە کافێ و سەنتەرەکان هەیەو کۆنێکتی ئەکەیت بە کۆمپیوتەرەکەتەوە.

Enable بۆ چالاک کردنی ئەو دیوارە ئاگرینەیە لەبەینی کۆمپیوتەرەکەت و ئەو هێڵی ئینتەرنێتەی کە کۆنێکتی ئەکەیت پێیەوە

Block all incoming connections واتە هیچ شتێک ناکاتەوە ئەگەر کۆنێکتیش بیت بە ئینتەرنێتەکەوە (ئەمەیان بە کەڵک نایەت چونکە ناتوانی ئیسفادە لە ئینتەرنێتەکە بکەیت)

Notify me when a new app is blocked واتە ئاگادارم بکەوە ئەگەر هەر بەرنامەیەک بلۆک کرا لەلایەن ئەنتی ڤایرۆسەکەوە



ئەم ئەنتی ڤایرۆسە کە بەخۆڕای بەدەستتمان هێناوە تەنها لەوانە ئەتپارێزێت کە لە کەتیگۆریەکەدا هەیە وەک Adware – virus – malware....




Protection Cloud

هەموو فایلە گومان لێکراوەکان ئەنێرێت بۆ Protection Cloud بۆ پشکنینی ڕاستەوخۆ لەسەر ئینتەرنێت. خۆکارانە فایلە تووشبووەکان و نەناسراوەکان دیاری دەکات و دەیانسڕێتەوە.

ئەو فایلە توشبوانەی لەناو کۆمپیوتەرەکەتدا هەیە بە ڕێگەی ئۆنلاین ئەپشکنرێ، کاتێک کە فایلەکەت نارد بۆ پشکنین پێت ئەڵێت کە ئەم فایلە (خاوێنە) یاخود (مالوەرە).

ئەتوانی ئەم زانیاریانەی فایلەکە بەدەست بهێنیت کاتێک کە ئەپلۆدت کرد لە Protection Cloud.

- شوێنی فایل
- ناوی فایل
- حالەت (بەرزکردنەوە – جارێ ماوێتی)
- ئەنجام (خاوێنە – خاوێن نیە)






ئەمەش وێنەیەک کاتێک کە ئەتەوێ بەرنامەیەک دابەزێنیت سەرەتا بە Protection Cloud بۆت ئەپشکنێت ئینجا ئەهێڵێت دایبەزێنیت.




## Passwords

ئەتوانی تێپەڕە وشە دابنێی بۆ بەرنامەی ئەڤێرا بۆ ئەوەی کەس نەتوانێت گۆڕانکاری لە سیستمی پارێزگاریەکەت بکات یاخود بیکوژێنەتەوە بۆ ئەوەی دەسەڵاتی بڵاو کردنەوەی مالوەری زیاتربێت لەسەر کۆمپیوتەرەکەت. ئەم کارە پێی ئەڵێن Social Engineering کە لە دوایدا باسی دەکەین.

ئەتوانی ئەو بەشانە کۆنترۆڵ بکەیت بە دانانی تێپەڕە وشەیەک کە ناتەوێ کەس دەستکاری بکات یاخود بیکوژێنێتەوە.




ئەڤیرا خۆکارانە ئەتپارێزێت لە ئیش پێکردنی هەرەمەکی درایڤەکانی – USB CD – DVD

با هەڵبژاردەکان وەک خۆی بێت دەستکاری مەکە ئەوەی پێویست بێت خۆی بۆی دیاری کردووێت




لێرەدا ئەتوانی ئەو بەشە سکان بکەیت لە کۆمپیوتەرەکەت کە خۆت مەبەستتە وەک سکان کردنی هارد درایڤەکانت یاخود سکان کردنی ئەو ئامێرانەی کە کۆنێکتی ئەکەیت بە کۆمپیوتەرەکەتەوە وەک USB



Real-Time Protection

Last file found واتە کۆتا فایل کە لە ئەنجامی سکان کردنەکەوە دۆزیومانەتەوە.

Last detection واتە کۆتا فایل کە گومانیان لێی هەبووە گرتویانە. بە کلیک کردن لەسەر information ئەتوانی زانیاری ئەو فایلە بەدەست بهێنیت.

Last file scanned واتە کۆتا فایل کە سکانی کردووە. لە خوارەوە لۆکەیشنی (شوێنی) فایلەکەت پێ ئەڵێت

Status information زنیاری تەواوی سکان کردنەکەیە. وەک چەند فایل سکان کراوەو چەند فایل گیراوە...




وە ئەتوانی تەواوی زانیاری لەسەر سکان کردنەکە بە ڕاپۆرت بەدەست بهێنیت.



بەم شێوەیە لەناو نۆتێکدا هەموو زانیاریەکان نوسراوە. زانیاری لەسەر ڤێرژنی بەرنامەکە. ئەو فایلانەی سکانی کردووە. لۆکەیشنەکانیان. ئەو فایلانەی کە گیراون...

```
avguard - Notepad
File  Edit  Format  View  Help
11/16/2016,8:32:20 [INFO] ---------------------------------------------------------
11/16/2016,8:32:20 [INFO] Engine version:  8.3.42.12
11/16/2016,8:32:20 [INFO] VDF version:  8.12.126.50
11/16/2016,8:32:20 [INFO] APC version:  2.7.1.3
11/16/2016,8:32:20 [INFO] RDF version:  14.0.5.44
11/16/2016,8:32:20 [INFO] Real-Time Protection Version: 15.00.23.58
11/16/2016,8:32:23 [INFO] [ACP] Load Avira Communication Protocol and initialize message broker
11/16/2016,8:32:23 [INFO] [ACP] Publish the ACP activity resource
11/16/2016,8:32:23 [INFO] [ACP] Start of the ACP message broker is triggered
11/16/2016,8:32:23 [INFO] Real-Time Protection configuration used:
       - Files to scan: scan files from local drives
       - Files to scan: Use file extension list: .386 .?HT* .ACM .ADE .ADP .ANI .APK .APP .ASD .ASF .ASP .ASX .AWX .AX .BAS
       - Device mode: Scan file on open, scan file on close
       - Actions: ask the user
       - Scan archive: Disabled
       - Heuristic: Enabled
       - Win32 file heuristic: Medium detection level
       - Logfile report level: Default
11/16/2016,8:32:24 [INFO] Online services are available.
11/16/2016,8:32:30 [INFO] Real-Time Protection configuration used:
       - Files to scan: scan files from local drives
       - Files to scan: Use file extension list: .386 .?HT* .ACM .ADE .ADP .ANI .APK .APP .ASD .ASF .ASP .ASX .AWX .AX .BAS
       - Device mode: Scan file on open, scan file on close
       - Actions: ask the user
```

وەک لە سەرەتای دابەزاندنی بەرنامەی ئەڤێراوە پێمان وتن کە کۆمەڵێک بەرنامە هەیە ئەتوانی لەگەڵ بەرنامەی ئەڤێرادا دایبەزێنی بۆ دابینکردنی پارێزگاری زیاتر. ئێستە ئەو بەرنامانە ڕوون ئەکەینەوە.

Avira Phantom VPN

زۆربەتا ئەزانن VPN چییە. VPN واتە (Virtual Private Network)

لە لاپەڕەکانی دوایدا زیاتر باسی ئەم شتە ئەکەین. بەکورتی ئەمە بۆ ئەوە بەکاردێ خۆت بە شاراوەی بهێڵیتەوە لەسەر ئینتەرنێت و خەڵک ئایپی سەرەکیت نەزانن IP (Internet Protocol)

دوو کلیک لە بەرنامەکە بکەو بیکەوە



پاشان کلیک لە Secure my connection بکە




پاشان چاوەڕێ ئەکەیت تا کۆنێکت ئەبێت بە ولاّتی ئەڵمانیاوە




وە ئەتوانی ولاّتەکانیش بگۆڕیت بە خواستی خۆت، وە ئەتوانی وا لە VPNەکە بکەیت کە کۆمپیوتەرەکەت هەڵبوو ڕاسەوخۆ چالاک بێت.



بڕی ئەم VPNە بریتییە لە 500 mb واتە توانای بەکارهێنانت لەو سنورە زیاتر نیە. used% واتە ئەونەت لەو 500MB بەکارهێناوە. لە دوایدا ئاشناتان ئەکەیت بە باشترین VPNی بێ سنوور بەخۆڕای.

Your connect is private واتە بە سەرکەوتووی کۆنێکت بوویت و ئایپیەکەت گۆڕی بۆ سەر ئایپی ئەو وڵاتە کە دیاریت کردووە.

Disconnect بۆ کوژاندنەوەی VPNکەیە




Avira Scout




ئەتپارێزێت لەو بەستەرانەی کە malware پێوەیە وە ئەو بەستەرانەی کە ڕات ئەکێشێت بۆ ئەوەی هاکت بکات، چونکە ئێستە هاک بە شێوەیەک پێشکەوتووە کە ئەتوانن لەڕێگەی لینکەوە خەڵک هاک بکەن.



هەندێک لە کۆمپانیاکان بە جاسوسی کردن لەسەر تۆ پارە بەدەست ئەهێنن، تەنانەت هەندێک کات هەموو ئەو زنیاریانەی کە کۆی کردۆتەوە ئەیفرۆشێتەوە بە کۆمپانیاکانی تر. بەبێ ئەوەی بزانی چی بەدەست هێناوەو ئەو کەسانە کێن کە زانیاریەکانت بەدەست ئەهێنن، بۆ ئەم مەبەستە ماڵپەڕێکیان هەیە کە بە تایبەت دایان ناوە بۆ بەدەستهێنانی زانیاری خەڵک.

هەندێک جار ماڵپەڕەکەش لاوەکی نیە، واتە بە شێوەیەک سیقەی لای خەڵک پەیا کردووە کە کەس درک نەکات ئەمان سیخوڕی ئەکەن بەسەر خەڵکەوە، ئیتر بە زۆری سەردانکەر بێت یاخود بە ناوبانگ.

بۆ دابینکردنی پارێزگاری لەم ڕووەوە کۆمەڵێک براوسەر هەیە کە تایبەت کاریان ئەمەیە، بەڵام باشترینیان بریتییە لە Ghostery

ئەتوانی زانیاری زیاتر بەدەست بهێنیت لەسەر ئەو بەرنامەیە (Ghostery)

بەڵام ئەتوانی ئەوەش بەکار نەهێنیت چونکە ئێمە Avira scoutمان هەیە کە هەمان کاری هەیە بەڵام لەوانەیە Ghostery باشتربێت چوونکە ئەزموونێکی زیاتری هەیە، هەر کوامێکیان بەکاربهێنیت گرنگ ئەوەیە بەکاری بهێنیت.

بۆ بەدەست هێنانی ئەو بەرنامەیە وەک لە یەکەمەوە باسمان کرد کە ئەتوانی لەکاتی دابەزاندنی بەرنامەی ئەڤێرا ئەویش دابەزێنیت.



ئەم براوسەرە بەکاربهێنن بۆ کارە سەرەکیەکانتان بۆ نموونە، بۆ خۆتۆمارکردن لە سایتێک یاخود یانەیەک، یان خۆتاماکردن لە سۆشیال میدیا وەک تویتەر و یوتوب و فەیسبووک....

هەتا ئەتوانن خۆتان بپارێزن و ئیهمالی مەکەن با زانیاریەکانتان بە ئاسانی بڵاو نەبێتەوە.

ئەمەش وێنەیەکی براوسەرەکەیە.




Safe Search بۆ هەموو براوسەرەکانمان زیاد ئەبێت Add-ons

بۆ نموونە من لێرە براوسەر Firefox بەکارئەهێنم وەک ئەبینن دوای ئەوەی کە Safe Searchم ئینستۆل کردن داوا دەکات کە کە رێگە بدەم لەسەر براوسەرەکەم کار بکات.

Another program on your computer would like to modify Firefox with the following add-on:


Avira SafeSearch Plus 1.4.1.371
By Avira
Location: C:\Users\Slave\AppData\Roaming\Mozilla\Firefox\Profiles\...


Install add-ons only from authors whom you trust.

Allow this installation

You can always change your mind at any time by going to the Add-ons Manager.

Continue

چۆنەیتی ئینستۆڵ کردنی Ghostery لەسەر براوسەرەکانمان

سەرەتا گوگل بکەوەو بنوسە Ghostery و بچۆ ناو ماڵپەڕەکە

پاشان وەک وێنەکە کلیک لەو بەشە بکە




بەبێ کێشە لەسەر ئەم براوسەرانە کار دەکات



INSTALL IT NOW

کلیک لە Add to browser بکە




پاشان ویندۆیەکت بۆ ئەکرێتەوە ئەو لینکەی سەرەوە لەناو ئەو براوسەرەدا بکەرەوە کە ئەتەوێ زیادی بکەی بۆ نموونە من ئەمەوێ بۆ فایەرفۆکسی زیاد بکەم بۆیە ئەم لینکە لێ ئەدەم لە براوسەری فایەرفۆکس

https://addons.mozilla.org/en-US/firefox/addon/ghostery/

پاشان ویندۆیەکت بۆ ئەکرێتەوە وە کلیک لە Add to Firefox ئەکەیت




پاشان کلیک لە install بکە




بە سەرکەوتووی زیاد بوو بۆ براوسەرەکەت




## دابەزاندنی Avira بۆ سیستمی Android & ios

ئەتوانیت ئەنتی ڤایرۆسی ئەڤیرا بۆ ئەندرۆید و ئای ئۆ ئێس دابەزێنیت بەهەمان شێوەی کە بۆ کۆمپیوتەرەکەت داتبەزاند، چونکە ئێستە ڤایرۆس و مالوەرەکان تەنها بۆ سیستمەکانی کۆمپیوتەر دروست ناکرێن، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئێستە زۆرینەی خەڵک بەکارهێنەری مۆبایلی زیرەکن هەوڵ ئەدەن

مالوەرێک دروست بکەن کە لەسەر سستەمی مۆبایلە زیرەکەکان سیخوڕی بکات.

ئەتوانیت لەڕێگەی ئەنتی ڤایرۆسی ئەڤێراوە مۆبایلە زیرەکەکەت بپشکنی بەهمان شێوە کە ئەتوانی کۆمپیوتەرەکەت بپشکنی.

بەهەمان شێوەی کۆمپیوتەر ئەتوانیت بەرنامەی ئەنتی ڤایرۆسەکە قوفڵ بکەیت هەتا ئەگەڕێیتەوە سەری و کاری پێ ئەکەیت، نەوەک کەسێک بیکوژێنێتەوە ئینجا بیەوێ مالوەرەکەی ئینستۆل بکات لەسەر مۆبایلەکەت.

هەر ئەوە نا بەڵکوو ئەتوانیت فایلەکانت لەڕێگەی ئەم بەرنامەیەوە بسڕیتەوە، وە هەروەها ئەتوانیت بەرنامەکانی ترت قوفڵ بدەیت لە ڕێگەی ئەم بەرنامەیەوە.

وە ئەتوانیت Secure Browsing بەکاربهێنیت وەک چۆن لەپێشدا ئاشنامان کردن بە براوزەری Scout، لێرەشدا ئەتوانی ئەو براوسەرە بەکاربهێنیت بۆ دابینکردنی پارێزگاری زیاتر، وە Blacklist تێدایە کە ئەتوانیت ئەو ژمارە مۆبایلانە بلۆک بکەیت کە ناتەوێت پەیوەندیت پێوە بکەن.

ئەتوانن ئەنتی ڤایرۆسی ئەڤێرا بۆ مۆبایلە زیرەکەکان بەدەست بهێنن بۆ هەردوو سیستمی ئەندرۆید و ئای ئۆ ئێس لەڕێگەی Google Play و AppStore، وە ئەتوانن بەخۆڕای بەدەستی بهێنن، ئەمەش ئەو زانیاریانەی کە بۆم باسکردن لە ڤیدیۆیەکدا کە کۆمپانیاکە خۆی بلاّوی کردۆتەوە (ڤیدیۆکە)

**کۆمەڵێک بەرنامە بۆ دابینکردنی پارێزگاری بۆ سیستمی ئەندرۆید:**

Security 360

AndroHelm Mobile Security

Avira Antivirus Security

Antivirus and Mobile Security by TrustGo

AVAST Mobile Security

AVG AntiVirus Security

Bitdefender Antivirus Free

CM Security

Dr Web Security Space

Eset Mobile Security and Antivirus

Kaspersky Internet Security

Lookout

Malwarebytes Anti-Malware

McAfee Security and Power Booster

Norton Security and Antivirus

**کۆمەڵێک بەرنامە بۆ دابینکردنی پارێزگاری بۆ سیستیمی ئای ئۆ ئێس:**

Avast Secure Me

McAfee Mobile Security

Lookout Mobile Security

Norton Mobile Security

Avira Mobile Security

F-Secure Safe

Security 360

**دابەزاندنی ئەو ئەنتی ڤایرۆسانەی کە بە پارەن بە خۆڕای.**

ئەمجارە باسی دابەزاندن و دامەزراندنی ئەو ئەنتی ڤایرۆسانە ئەکەین کە بە پارەن بە خۆڕای.

سەرەتا یەکێک لەم دوو بەرنامەیە دابەزێنە لەسەر کۆمپیوتەرەکەت (BitTorrent – uTorrent) کە لەڕێگەیەوە ئەتوانین فایلەکانی تۆرێنت دابەزێنین.

DOWNLOAD BITTORRENT

چەند جۆرێکی بەدەست هێنانمان هەیە

- یەکێکیان بەخۆڕاییە تەنها یەک تایبەتمەندی تێدایە، ئەویش خێرا دابەزاندنی فایلەکەیە (هەڵبەتە ئەگەر خەتەکەشت خێرا بێت)
- ئەوی تریان نرخی 4.95$ بۆ ساڵێک. تەنها جیاوازی لەگەڵ ئەوەی یەکەمدا ئەوەیە کە ئەمیان ڕێکلام بێزارت ناکات.
- ئەوی سێهەم 19.95$ بۆ ساڵێک
  - خێرایە لە دابەزاندن
  - هیچ ڕێکلامێکی تێدا نیە
  - ئەتپارێزێت لە مالوەر و ڤایرۆس
  - یارمتیدانی کڕیار
  - جۆری فایلەکە ئەگۆڕێت بۆ هەر جۆرێک کە بتەوێ وەک mov. بۆ mp4.
  - ئەتوانیت ڕاستەوخۆ سەیری ئەو فیلمانە بکەیت کە لە سایتەکانی تۆرێنت هەیە بێ ئەوەی دایانبەزێنیت.

## Compare Features

| Feature | Free Download | Get BitTorrent Ad-free $4.95 USD/year | Get BitTorrent Pro $19.95 USD/year |
|---|---|---|---|
| Fast downloads with automatic bandwidth management | ✔ | ✔ | ✔ |
| No ads | ✖ | ✔ | ✔ |
| Automatic protection from viruses and malware | ✖ | ✖ | ✔ |
| Premium customer support | ✖ | ✖ | ✔ |
| Convert downloads to play on any device | ✖ | ✖ | ✔ |
| Stream torrents instantly | ✖ | ✖ | ✔ |

بۆ دابەزاندنی بەرنامەکە بەخۆڕای کلیک لە Free Download بکە







BitTorrent Install Wizard
License Agreement
Please review the license terms before installing BitTorrent
Scroll down to see the rest of the agreement.
End User License Agreement (EULA)
By accepting this agreement or by installing BitTorrent or µTorrent or other software offered by or on behalf of BitTorrent, Inc. (the "Software") or by clicking "Install", you agree to the following terms, notwithstanding anything to the contrary in this agreement.
The Software is a peer-to-peer file distribution application distributed by BitTorrent, Inc.
1. License
Subject to your compliance with these terms and conditions, BitTorrent, Inc. grants you a personal, freely revocable, limited, royalty-free, non-exclusive, non-transferable, non-sublicensable, non-assignable license to use the Software, solely for your personal, non-
By clicking "I Agree", you acknowledge that you have read and agree to the End User License Agreement and Privacy Policy.
< Back
I Agree


BitTorrent Install Wizard
Choose Install Options
Create Start menu entry
Create Quick Launch icon
Create Desktop icon
< Back
Next >


BitTorrent Install Wizard
Configuration
Select BitTorrent configurations (recommended settings are pre-selected)
The following options automate the configuration of some additional settings in Windows.
Additional Settings
Add an exception for BitTorrent in Windows Firewall
Start BitTorrent when Windows starts up
< Back
Next >




ئەمەش ڕووکاری بەرنامەکە




ئێستە باس لە دابەزاندنی ئەو شتانە ئەکەین کە پێویستمانە لە تۆرێنت، بۆ نموونە لێرەدا باس لە دابەزاندنی ئەنتی ڤایرۆسی کاسپەر سکای ئەکەین.

گرینکترین خاڵ لە بەکارهێنانی تۆرێنتدا بریتییە لە بەکارهێنانی VPN

کاتێک کە سایتێکی وەک extratorrent ئەکەینەوە پێمان دەڵێت کە پێویستە VPN بەکاربهێنین، چونکە چونکە حوکمەت لەڕێگەی ئایپیەکەتەوە ئەتوانن ئەو چالاکیانەت بزانن کە لەسەر تۆرێنت ئەنجامی ئەدەیت، خۆی لە ئەسڵدا

بەکارهێنانی تۆرێنت کارێکی نایاساییە هەم بەبۆنەی ئەو نەرمەکاڵاو فیلمانەی کە تیایەتی و زەرەرێکی زۆر بە کۆمپانیاکانی وەبەرهێنان ئەگەیەنێت وە بەبۆنەی ئەوەی کە هەندێک هاکەر تۆرێنت بەکار ئەهێنن بۆ بەدەست هێنانی نێچیر و هاک کردنی خەڵک. بە کورتیەکەی هەتا ئەتوانن تۆرێنت بەکار مەهێنن بەڵام ئەگەر زەروور بوون بە بەرنامەیەک و پارەتان پێنەبوو کە پێشتان نیە ئەوە پەنا ئەبەن بۆ بەکارهێنانی تۆرێنت.

ئێستە لێرەدا باسی ئەوە ئەکەین چۆن خۆمان بپارێزین لە هاک کردن و ئاشکرابوون لەکاتی بەکارهێنانی تۆرێنتدا.

**Warning! Protect Yourself from Lawsuits and Fines!**

**Your IP Address is** **Location is Iraq**

Your IP Address is visible to EVERYONE. Hide your IP ADDRESS with a VPN while torrenting!
**ExtraTorrent** strongly recommends using Trust.Zone VPN to anonymize your torrenting. **It's FREE!**

**Hide my IP address!**

ئەم سایتە پێشنیاری VPN بۆ ئەکات کە بە خۆڕاییە. ئەتوانن ئەوە بەکاربهێنن یاخود ئەو VPN بەکاربهێنن کە لە دوایدا باسیان ئەکەین.

لەپێش هەموو شتێکدا فایلێک دامەگرە لە تۆرێنت کە Seedی زۆر نیە. واتە کە خەڵک زۆر باوەڕیان پێی نیە. وە زۆربەی جاریش ئەو فایلانەی کە seedیان زۆر نیە کێشەی دابەزاندنیان هەیەو دانابەزن. وە هەر فایلێک زۆر گرنگ بێت کاتێک کە لە تۆرێنت بڵاو ئەکرێتەوە ئەوە لەلایەن خەڵکەوە ئەپشکنرێ ئەگەر زانیان خاوێنە ئەوە سیدی ئەدەنێ و ڕێگە ئەدەن لەناو سایتەکەدا بمێنێتەوە.

بۆ نموونە ئەم فیلمە سیدی زۆرە کێشەی نیە ئەتوانن دایبەزێنن.

**Suicide.Squad.2016.EXTENDED.720p.WEBRip.x264.AAC-ETRG torrent**

Torrent Description | Report a problem! | View/Add Comments (22)

| | |
|---|---|
| Download torrent: | Suicide.Squad.2016.EXTENDED.720p.WEBRip.x264.AAC-ETRG torrent |
| Info hash: | D84AC81CB6BB3AE055ACA1A75B4DDEB30F00E38B |
| Category: | Categories > Movies torrents > Action torrents |
| Trackers: | 13 View all torrent trackers > |
| Health: | seeds: 24254 , leechers: 14376 \| Update > |
| Torrent language: | English |
| Total Size: | 0.98 GB |
| Number of files: | 2 View torrent files > |
| Torrent status: | Added by trusted uploader Ozlem VIP *ETRG* |
| Uploader: | Ozlem VIP *ETRG* |
| Torrent added: | 2016-11-16 09:30:26 \| ***Last edit:*** *2016-11-16 09:40:48 by* **SaM** VIP |
| Users rating: | 7.10 / 10, total **15** votes. Latest by: Cecile VIP, vijay1994 VIP, elbastardo1b VIP, ef3trix VIP, StarLoardReborn VIP |

DOWNLOAD

لێرەدا ئێمە ئەمانەوێ ئەنتی ڤایرۆسی کاسپەر سکای دابەزێنین بەخۆڕای، چونکە خۆی بەپارەیە. ئەتوانیت سایتەکانی تۆڕێنیت بەکاربهێنیت بۆ دابەزاندنی ئەو بەرنامەیە.

پێش هەموو شتێک ئێوە ئەتانەوێ کۆتا وەشانی ئەو شتە دابەزێنن کە ئەتانەوێ، لە گوگل بگەڕێن بۆ ئەنتی ڤایرۆسی کاسپەر سکای پاشان سایتی سەرەکی بکەنەوەو بزانن کۆتا وەشانی ئەو بەرنامەیە چییە.

پاشان کە گەڕان بەدوای ئەو بەرنامەیەی کە ئەتانەوێ و دۆزیتانەوە سەیرکەن بزانن وەشانەکەی ئەوەیە کە ئێوە ئەتانەوێ. ئەگەر ئەوەبوو ئینجا سەیری سیدەکەی بکەن بزانن چەنێکە. پاشان سەیری ئەو کۆمێنتانە بکەن کە بۆی نوسراوە بزانن خەڵک ڕای چیە دەربارەی ئەو بەرنامەیە یاخود ئەو فیلمەی کە بڵاوی کردۆتەوە.

**Search for torrents results:** RSS
total **1690** torrents found (watch for "kaspersky" new coming torrents Watch >)

1 2 3 4 5 6 7 8 9 > >>>  Torrents per page: 50

| | Added | Size | S | L | Health |
|---|---|---|---|---|---|
| Kaspersky Anti-virus 2017 17.0.0.611 (b) Final + Trial Resetter [OS4World] in Windows - Security, by OSTech 6 | 21d | 175.40 MB | 250 | 30 | |
| Kaspersky Internet Security 2017 17.0.0.611[by Robert] in Windows - Security, by robertyyy 5 | 21d | 176.66 MB | 79 | 6 | |
| Kaspersky Internet Security 2017 v17.0.0.611 + 360 Days Crack - {Core-X} 7.75 in Windows - Other, by cryptox 22 | 41d | 170.45 MB | 306 | 8 | |
| KEYS for ESET, Kaspersky, Avast, Dr.Web, Avira [September 25] (2016) [SadeemPC] 9.00 in Windows - Other, by SadeemPC 3 | 52d | 1.76 MB | 527 | 13 | |
| Kaspersky Internet Security / Anti-Virus / Total Security v17.0.0.611.0.184.0 [OS4World] 7.75 in Windows - Security, by OSTech 13 | 76d | 517.06 MB | 200 | 30 | |
| KEYS for ESET, Kaspersky, Avast, Dr.Web, Avira [August 22] (2016) [SadeemPC] in Windows - Other, by SadeemPC 4 | 89d | 1.17 MB | 96 | 0 | |
| Kaspersky Internet Security 2017 Setup + Crack {1 Year} - {Core-X} {CTRC} 10.00 in Windows - Security, by cryptox 18 | 89d | 170.45 MB | 747 | 26 | |
| KEYS for ESET, Kaspersky, Avast, Dr.Web, Avira [July 31] (2016) [SadeemPC] in Windows - Other, by SadeemPC 4 | 111d | 1.59 MB | 156 | 0 | |

دوای ئەوەی کە دڵنیابوونەوە کوامەیانە ئەوە کلیکی لێبکەن

پاشان سەیری فایلەکە بکە بزانە قەبارەی چەنەو کەی بلاو کراوەتەوەو هەموو زانیاریەکان کە نوسراوە.

پاشان کلیک لە Download بکە

